



# خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس لە کۆیە

## پەرتووکی وانەکان

ئامادەکردنی : ئەندازیار کێوان سلیمان

# خشتەی وانەکان

| هەفتە | بابەت |
| --- | --- |
| هەفتەی یەکەم | سەرەتایەکە لەسەر مایکرۆسۆفت ئەکسس و دروستکردنی خشتە |
| هەفتەی دووەم | دروستکردنی کوێری |
| هەفتەی سێیەم | دروستکردنی فۆرم |
| هەفتەی چوارەم | دروستکردنی ڕیپۆرت |
| هەفتەی پێنجەم | داتا ماکرۆ و سەرەتایەک لەسەر VBA |






## خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس لە کۆیە

## بەشی یەکەم

### سەرەتایەکە لەسەر مایکرۆسۆفت ئەکسس و دروستکردنی خشتە



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس
وانەی یەکەم
مایکرۆسۆفت ئەکسس و دروستکردنی خشتە

ئامادەکردنی: ئەندازیار کێوان سلێمان



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## من کێم ؟

کێوان سلێمان صالح

- یەکەمی کۆلێژی ئەندازیاری پرۆگرامسازی لە زانکۆی کۆیە ٢٠١٣-٢٠١٤
- مامۆستا لە پەیمانگای کۆیەی ئەهلی بۆ زانستەکانی کۆمپیوتەر.

2

ئامادەکردنی: ئەندازیار کێوان سلێمان



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## ئەجێندای ئەم وانەیە

- سەرتایەک دەربارەی داتابەیس
- داتابەیسی پەیوەندی دار (Relational Database)
- دەروازەیەک بۆ نێو مایکرۆسۆفت ئەکسس
- دروستکردنی داتابەیس
- دیزاینکردنی خشتە(Table Design)

3

ئامادەکردنی: ئەندازیار کێوان سلێمان



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## داتابەیس چییە ؟

- داتابەیس کۆمەڵێک زانیاری ڕێکخراوە، کە بەئاسانی دەتوانرێت دەستیان پێ بگەیەنێت ، وە ڕێکیان بخەیت و گۆڕانکارین تێدا بکەیت.
- بۆ نموونە داتابەیسی کتێبخانەکان کە ناونیشانی چەندان کتێب و نووسەری چەندان بابەتی جیاواز لە خۆ دەگرێت، کە دەتوانرێت زۆر بەئاسانی کتێبەکان لێک جیا بکەیتەوە تەنیا لەڕێگەی داخلکردنی زنجیرە ژمارەی کتێبەکان.



4

ئامادەکردنی: ئەندازیار کێوان سلێمان

## داتابەیس چییە؟

- هەر ئەپلەیکەیشنێکی داتابەیس لە دوو بەش پێک دێت:
- بەشی ناوەوە (Back End)
  - سیستەمی ڕێکخستنی داتابەیس(Database Management System)
  - مەکینەی داتابەیس(Database Engine)
  - سێرڤەری داتابەیس(Database Server)
- بەشی دەرەوە(Front End)



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## سیستەمی ڕێکخستنی داتابەیس (Database Management System) چییە؟

- ئامرازی دروستکردن و ڕێخستنی داتابەیسن.
- کە لەڕێگەیانەوە ئەتوانین کۆنترۆڵی دەستکەیشتن بە داتابەیەسەکە بکەین و هەروەها بۆ لایەنی پاراستنی داتابەیس و وە کۆنترۆلکردنی و گەڕاندنەوە داتاکان لە کاتی وون بوون سڕینەوەیان وە هەروەها زۆر کاری تر.
- وەکو مایکرۆسۆفت ئەکسس، MySql، Oracle، Microsoft Sql Server





خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## مەکینەی داتابەیس(Database Engine) چییە؟

- مەکینەی داتابەیس پارچەیەکە کە لەلایەن سیستەمی ڕێکخستنی داتابەیس(DBMS) بەکار دەهێندرێت بۆ چوار مەبەست :
  - گەڕاندنەوەی زانیارەیەکانی ناو داتابەیسکە(Query)
  - زیادکردنی داتای نوێ بۆ داتابەیسەکە ( Add).
  - نوێکردنەومو گۆڕانکاری لە داتاکان(Update/Maintain).
  - سڕینەوەی داتاکان(Delete).



## سێرڤەری داتابەیس(Database Server) چییە ؟

- سێرڤەر ئەو کۆمپیوتەریە کە داتابەیسەکەی تیدا خەزنکراوە ، کە وەکو خەزینەیەک بەکاردێت بۆ خەزنکردن داتاکانی داتابەیسەکە، وە هەر لەرێگەی ئەو سێرڤەرەوە ئەتوانین خزمەتگوزاریەکانی داتابەیسەکان بە کۆمپیوتەرێکی تر بگەیێنین.

## ڕووکاری دەرەوەی داتابەیس

- ئەو ڕووکارەیە کە بەکارهێنەری داتابەیسەکە دەیبینت، کە پێشی دەگوترێت(GUI) کە بەستراوەتەوە بە داتابەیسەکە لە رێگەی سیستەمی ڕێکخستنی داتابەیس(DBMS) ئەو ئامرازانەی کە لە ڕووکاری دەرەوەی داتابەیس دەبینرێن ئەمانەن:
  - فۆرم(Form)
  - ڕاپۆرت(Report)





## جۆرەکانی سیستەمی داتابەیس

- چەندین جۆری سیسەتەمی داتابەیسمان هەیە وەکو:
- سیستەمی داتابەیسی هەرەمی( Hierarchical Database System).
- سیستەمی داتابەیسی نێتۆرکی(Network Database System).
- سیستەمی داتابەیسی پەیوەندی دار( Relational Database System).

## داتابەیسی پەیوەندی دار ( Relational Database )

- جۆرێکە لە داتابەیس کە لە کۆمەڵێک پەیوەندی یاخود خشتەی دوو ڕوو پێک هاتووە، کە لە ڕێگەی ئەو پەیوەندیانە یاخود ئەو خشتە دوو ڕووانەوە زانیارەکان خەزن ئەکرێن تێیدا.
- بۆ نموونە تۆ ئەتەوێت زانیاریەکانی فەرمانبەرانی کۆمپانیاکەت تۆمار بکەیت، لە داتابەیسی پەیوەندی دار، پێویست ئەکات چەندین خشتە دروست بکەیت بۆ تۆمارکردنی هەموو زانیاریەکان دەربارەی فەرمانبەرەکان بۆ وێنە: خشتەی فەرمانبەر، خشتەی بەشەکان،وە خشتەی موچە، کە هەریەکەیان بە پەیوەندیەک لەگەڵ ئەوی تر ئەبسترێنەوە.







Table name: EMPLOYEES

| EMPLOYEE_ID | FIRST_NAME | LAST_NAME | EMAIL | PI |
|---|---|---|---|---|
| 100 | Steven | King | SKING | 51 |
| 101 | Neena | Kochhar | NKOCHHAR | 51 |
| 102 | Lex | De Haan | LDEHAAN | 51 |

Table name: DEPARTMENTS

| DEPARTMENT_ID | DEPARTMENT_NAME | MANAGER_ID |
|---|---|---|
| 10 | Administration | 200 |
| 20 | Marketing | 201 |
| 50 | Shipping | 124 |







## بۆچی داتابەیسی پەیوەندی دار ( Relational Database) بەکاربهێنین ؟

- زۆرترین سوودی داتابەیسی پەیوەندیدار بۆ ڕێکری کردنە لە دووپاتبوونەوەی داتاکان لە ناو داتابەیس، بە گشتی بۆ چارسەرکردنی ئەم کێشانە بەکاردێت:
  - دووپاتبوونەوەی داتاکان( Data Redundancy)
  - نوێکردنەوەی داتاکان بەناڕێکی
  - داخلکردنی داتاکان بە ناڕێکی
  - سڕینەوەی داتاکان بە ناڕێکی





خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## بۆچی داتابەیسی پەیوەندی دار ( Relational Database) بەکاربهێنین ؟

- لە سوودەکانی داتابەیسی پەیوەندی دار ئەمانەن:
  - داخلکردنی داتاکان بە کارایی
  - کەمترین چاککردنەوە لە بیناى داتابەیس
  - شیکردنەوەی داتاکان بە دەقیقی
  - ڕێگری کردن لە ناڕێکی لە داتاکان



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## مایکرۆسۆفت ئەکسس چییە؟

- مایکرۆسۆف ئەکسس ٢٠١٣ نوێترین ڤێرشنی مایکرۆسۆفت ئەکسسە
- مایکرۆسۆفت ئەکسس بوو بە شێک لە مایکرۆسۆفت ئۆفیس لە مایکرۆسۆفت ئۆفیسی ٩٧
- لەم کۆرسەدا ئێمە مایکرۆسۆفت ئەکسس ٢٠١٠ بەکاردەهێنین.




Access Timeline





خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## هەنگاوەکانی کردنەوەی مایکرۆسۆفت ئەکسس ٢٠١٠




١ - لەسەر تاسکباری ویندۆز، کلیک لەسەر دوگمەی ستارت پاشان کلیک بکە لەسەر (All Programs) لیستی پرۆگرامەکانی ناو کۆمپیتەرەکەت نیشان دەدرێت.

٢ - کلیلک لەسەر (Microsoft Office) بکە فۆلدەرەکە ئەکرێتەوە، کۆمەڵێک پرۆگرامی تێدایە.

٣ - کلیک لەسەر (Microsoft Access 2010)بکە، پاشان ویندۆزی مایکرۆسۆفت ئەکسس دەکرێتەوە.








## تابی فایل یاخود پشت پەرە(Backstage View) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس ٢٠١٠

- لە دوای کردنەوی مایکرۆسۆفت ئەکسس ٢٠١٠ لەلای چەپەوە کۆمەڵێک شریتێک نیشان دەدرێت کە کۆمەڵێک تاب و کۆماندی خێرای تێدایە،پێی دەوترێت پشت پەردە(Backstage View)

کۆماندە خێراکان»

- Save: بۆ خەزنکردنی ئەو تەنەی (object) کە ئێستا کردووتەوە.
- Save Object As: دووبارە خەزنکردنی ئەو ئۆبجێکتەی کە کردووتەوە بە ناوێکی تر
- Save Database As: دووبارە خەزنکردنی داتابەیسەکە بەناوێکی تر.
- Open: بۆ کردنەوەی داتابەیسی تر کە لەنێوکۆمپیوتەرەکەت خەزن کراوە.
- Close Database: بۆ داخستنی داتابەیسەکەت.
- ** لە ژێر کۆماندە خێراکان ئەو داتابەیسانە تێدا نیشان دراوە کە پێشتر کراونەتەوە( Recently Databases).

## تابی فایل یاخود پشت پەرە(Backstage View) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس ٢٠١٠

- وە هەر لیستی فایل شه ش کۆماند تابی تر هەن.
- Info: ناو داتابەیسکەت، شوێنی خەزنکردن و چەند شتێکی تر، وەکو:
  - Security Settings: ڕێکخستنی پاراستن
  - Compact & Repair بچووککردن و چاککردنەوە
  - Encrypt with Password شفرەکردن بە پاسوۆرد
- Recent: بینین و کردنەوەی لیستی ١٧لەو داتابەیسانەی کە پێشتر کراونەتەوە.
- New: کردنەوەی ئەو پەڕەی کە لەسەرەتای کردنەوەی ئەکسس نیشان دەدرێت.
- Print: چەندین پێشنیار هەن بۆ پرینت کردن وەکو (Print)،(Quick Print)،وە(Print View)
- Save & Publish: خەزنکردنی داتابەیس بە شێوازی جیاواز.
- Help: هەموو زانیاریەک دەربارەی مایکرۆسۆف ئەکسس.





## شریتی ئامرازە خێراکان (Quick Access Toolbar)

- ئەم شریتە ئەکەوێتەی لای چەپی بەشی سەرەوەی ویندۆی مایکرۆسۆفت ئەکسس.
- شریتی ئامرازە خێراکان لە باری ئاسایی ئەم دوگمانەی تێدایە (Save)،(Undo) وە(Redo)
- ئەتوانی ئەم شریتە ڕێکبخەیت لە ڕێی ئەم سەهمە سەروژێرکراوە کە لای ڕاستی ئامرازەکانە، وە ئەتوانی هەر ئامرازێکی تر بوێت زیادی بکەیت بۆ شریتەکە.



## شریتی تابەکان(The Ribbon)

- شریتی تابەکان لە مایکرۆسۆفت ئۆفیسی ۲۰۰۷ ەوە ناسێنراوە.
- شریتی تابەکان هەموو ئەم ئامراز و تولآنەی تێدایە کە شریتی لیستەکان(Menu bar) هەبوو لە مایکرۆسۆفت ئۆفیسەکانی پێش ڤێرشنی ۲۰۰۷
- ئەم شریتە هەموو ئەم کارەکان و کۆماندەکانی مایکرۆسۆفت ئەکسسی تێدایە.
- لەشریتی تابەکانی مایکرۆسوف ئەکسس چوار تابی سەرەکی هەن(External Data،Create،Home، (Database Tools






خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## شریتی تابەکان(The Ribbon)

- تابی لەروو زەمینە(Contextual Tab) ئەم تابە نیشان ئەدرێت لەلای ڕاستی تابی ( Database Tools) کاتێک کە کاردەکەیت لەسەر ئۆبجێکتێکی دیاری کراوی داتابەیس کە بەچەندین شێواز نیشان دەدرێت وە وون دەبێت بە داخستنی ئەو ئۆبجێکتەی کە کاری لەسەر دەکەی.



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## بەشی گەڕۆک (Navigation Pane) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس




بەشی گەڕۆک هەموو کارێکتەرە سەرکیەکانی داتابەیس لە مایکرۆسۆفت ئەکسس لەخۆ دەگرێت.

کارێکتەر سەرەکیەکانیش ئەمانەن:

- خشتە (Table): بۆ خەزنکردنی زانیاریەکان
- کۆیری(Query): بۆ شیکردنەوە هەڵسەنگاندنی زانیاریەکان.
- فۆرم(Form) : شێوازی پێشەکەوتوو بۆ نیشاندانی زانیاری داتاکان.
- راپۆرت(Report): بۆ نیشاندانی زانیاریە رێکخراوەکان
- ماکرۆ(Macro) و مۆدیول (Modules): پێدانی پرۆسێسی تۆتانیکی بە داتابەیسەکەت.



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## کلاینت داتابەیس(Client Database) و وێب داتابەیس(Web database)

- لە ڤێرشنەکانی پێش مایکرۆسۆفت ئەکسس ٢٠١٠ تەنیا یەک شێوازی داتابەیس هەبوو، ئەویش کلاینت داتابەیس بوو، ئەم جۆرە داتابەیس تەنیا ئەتوانرێت لەیەک کاتدا لەسەریەک کۆمپیوتەر کاری پێبکرێت.
- بەڵام لەڤێرشنی مایکرۆسۆفت ئەکسس ٢٠١٠ جۆرێکی تریش زیاد کرا کە وێب داتابەیسە، کە ئەتوانرێت لە رێگەیەوە مایکرۆسۆفت ئەکسس بەکاربهێنیت لەناو وێب براوسەرەکان، بەڵام زۆرێک لەو خاسیەت و ئامرازانە نین کە لە کلاینت داتابەیس هەن.
- لەم کۆرسەی ئێمە زیاتر تیشک ئەخەینە سەر جۆری یەکەم کلاینت داتابەیس.

خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## هەنگاوەکانی دروستکردنی داتابەیس لە مایکرۆسۆفت ئەکسس

*نموونە ١*

١- مایکرۆسۆفت ئەکسس بکەرەوە.

٢- پاشان لە باک ستەیج ڤیو (Bland database) هەڵبژێرە.

٣- پاشان لای ڕاستی شاشەکەتەوە، ناو و شوێنی خەزنکردنی داتابەیسەکە دیاری بکە.

٤-لە ناو بنووسە(تۆمارگای زانکۆی کۆیە) وە شوێنی خەزنکردنەکەشی بکە فۆڵدەری ( McAccess Training) لە دراڤی دی کۆمپیوتەرەکەت.

٥- پاشان دوگمەی ( Create) دادەگرین، داتابەیس دروست دەبێت.

File Name

١ ٢ ٣

D:\McAccess Training\

Create

25

ئامادەکردنی: ئەندازیار کیوان سلێمان

خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



26

ئامادەکردنی: ئەندازیار کیوان سلێمان

## ڕووکاری بەکارهێنەری مایکرۆسۆفت ئەکسس(User Interface)








## دروستکردنی خشتە (Table)

چەندین ڕێگا هەیە بۆ دروستکردنی خشتە(Table) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس:

- دروستکردنی خشتە لە ڕێگەی تێمپلەیتی حازر کە خۆی تەیبلی تێدایە، ناو مایکرۆسۆفت ئەکسس.
- دروستکردنی خشتە بە پشتبەستن بە (Application Parts) لە تابی (Create).
- دروستکردنی خشتە لەڕێگەی (Table) لە تابی (Create).
- دروستکردنی خشتە لەڕێگەی (Table Design) لە تابی (Create).

## دروستکردنی خشتە (Table)

- دروستکردنی خشتە لە (Table Design)
- بۆ دروستکردنی خشتە کلیک لەسەر تابی ( Create) بکە.
- پاشان لە گرووپی (Table)  کلیک لەسەر (Table Design) بکە
- رووکاری (Table Design) نیشان ئەدرێت.






خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## دروستکردنی خشتە (Table)

❑ شوێنی داخلکردنی خانەکان(Field Entry Area)  لەسێ بەش پێک دێت:

- ناوی خانە (Field Name) : ناوی خانەکە دەنووسرێت لەناوی وە ئەبێ لە ٦٤ پیت زیاتر نەبێت، وە سپەیس رێگە پێدراوە.
- جۆری داتاکە(Data type): جۆری داتای ئەو خانەیە جا نوسین بێت، ژمارە یاخود بەروار بێت.
- زانیاری لەسەرە خانەکە(Field Description) : بۆ داخلکردنی زانیاری زیاتر لەسەر خانەکە.

❑ شوێنی خاسیەتەکانی خانە(The Field Properties area)

- ئەم شوێنە بە گوێری جۆری داتاکە گۆرانکاری بەسەردادێت، کە لەرێگەیەوە دەتوانین خاسیتەکانی داتاکە گۆرانکاری پێ بکەین.

❑ زانیاری سەرتایی یارمەتیدەر (Basic Help Information area)

- زانیاری سەرەتایی پێشکەش دەکات دەربارەی خانەکە، لە هەر حالەتیک بێت،لە ناو شوێنی داخلکردنی خانەکان بێت یا خود لە شوێنی خاسیەتەکانی خانەکەبی.

## ج

- **نموونە ٢ دروستکردنی خشتەی (خوێندکار)**
- کلیک لەسەر تابی(Create) دەکەین، پاشان لەگرووپی (Table) کلیک لەسەر (Table Design) دەکەین.
- هەموو خانەکان داخل دەکەین وەکو لە وێنەکەدا دیارە.
- کلیک لەسەر دوگمەی (Save)بکە لەسەر شریتی خێرا (Quick Access Toolbar) بکە.
- بۆکسێکت بۆ ئەکرێتەوە لەخانەی (Table Name) بنووسە(خوێندکار)
- پاشان دوگمەی (Ok) دادەگرێت و خشتەکە دروست دەبێت.

Save As
Table Name:
خوێندکار
OK Cancel





## دروستکردنی خشتە (Table)

- پاش دروستکردنی خشتە ڕاستەوخۆ بۆ بەشی لای چەپی ویندۆزکەمان زیاد ئەبێت.

## جۆرەکانی داتا (Data Types )

- لە شوێنی داخلکردنی خانەکانی خشتە لە بەشی (Data Type) لیستێک نیشان ئەدرێت بۆ دیاری کردنی جۆری خانەکە.
- کە (١٢) جۆری داتا هەیە، ئەتوانرێت هەریەکێکیان هەڵبژێریت بۆ خانەکەت.
- ئەوەی ڕاستییە داتا بەپێی بە گشتی سێ جۆر داتای هەیە،کە ئەوانی تریش هەموو بەشی ئەم سێ جۆرەن
  - ❖ نووسین(Text)
  - ❖ ژمارە(Number)
  - ❖ کات و بەروار(Date/Time)

| جۆری داتا | زانیاری | قەبارە |
|---|---|---|
| Text | پیتەکانی نووسین | تا ٢٥٥ پیت |
| Memo | پیتەکانی نووسین، ئەو نووسینانەی کە درێژیان زیاترە لە ٢٥٥ پیت | تا ٦٥٥٣٥پیت |
| Number | ژمارەکان، کەرتدارەکان و بێ کەرتەکان ( Integers & Fractional) | لە ١ بایت، ٢ بایت ٣ بایت، ٤بایت یا ١٦ بایت |
| Date/Time | کات و بەروار | ٨ بایت |





## جۆرەکانی داتا (Data Types )

| جۆری داتا | زانیاری | قەبارە |
|---|---|---|
| Currency | بۆ نووسینی هێمای پارە(دراو) | ٨ بایت |
| AutoNumber | ئەکە ژمارەیە، کە خۆی ئۆتۆماتیکی زیاد دەکات، کاتێک داتا داخڵی خانەکانی خشتە دەکەین. | ٤ بایت یا ١٦ بایت |
| Yes/No | تەنیا بۆ جۆرە داتایەک بەکاردێت کە پێی دەڵێن بوولیان(Boolean) کە شێوازی (Yes/No)،(True/False)، وە (On/Off)هەیە. | ١ بت |
| OLE Object | بۆ خەزنکردنی چەند جۆرە فایلێک بەکاردێت وەکو وێنە و فایلی مایکرۆسۆفت ئۆفیس | تا ١ گیگا بایت |
| Attachment | بۆ خەزنکردنی وێنە، ڤیدیو، فایلی ئۆفیس | قەبارەی ٧٠٠ کیلۆ بایت بۆ فایلی ئاسایی وە ٢ گیگا بایت فایلی کۆمپرێس کراو |
| Hyperlink | بۆ خەزنکردنی لینکی وێب، وە لینک بۆ کردنەوەی بەشەکانی تر داتابەیسکەت | ٦٥٥٣٥پیت |







## جۆرەکانی داتا (Data Types )

- جۆرەکانی داتای تایبەتمەند
  - Lookup Wizard
  - Calcualted

| جۆری داتا | زانیاری | قەبارە |
|---|---|---|
| Lookup Wizard | لە ڕاستیدا ئەمە جۆری داتا نییە، بەڵکو بۆ دروستکردنی ئەم خانانە بەکاردێت کە نرخەکانیان لە خشتەیەک یا کویریەک یا لیستێک لە نرخ وەردەگرن. | قەبارەکەی پەیوەستە بە خشتەیە یا ئەو کویریەی کە داتاکەی لێوەر دەگیرێت. |
| Calculated | بۆ پیدانی نرخ بە خانەیەک کە نرخەکەی بە یاسایەک دروستکرابێت لە وەرگرتنی نرخی خانەیەک یا خود زیاتر. | نرخەکەی پەیوەستە بە خانەی کە نرخەکانیان وەردەگیرێت. |







خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## جۆرەکانی داتا (Data Types )

- خاسیەتەکانی خانەکان (Field Properties)
- هەر خانەیەک کۆمەڵێک خاسیەتی تایبەتی هەیە کە لە شوێنی خاسیەتەکان(Field Properties Area) نیشان ئەدرێت.
- خاسیەتەکانی هەر خانەیەک دەگۆڕێت بەگوێرەی ئەو جۆرەی داتایەی کە بۆ خانەکەمانان هەڵبژاردووە.

| | Text | Number | Date/Time |
|---|---|---|---|
| Field Size | گەورەترین ژمارەی پیت | دیاری کردنی جۆرەکانی ژمارەکان وەکو (integer) و (Single) وە هتد. | نییە |
| Format | بۆ دیاریکردنی شێوازی خانەکە جا شێوازی حازر بێت یاخود خۆت ڕێکی بخەیت بۆی. | | |
| Decimal places | نییە | بۆ دیاری کردنی گەورەترین ژمارەی ڕەنووسە کەرتیەکان بۆ ژمارەکان | نییە |
| Input Mask | وەکو (Format) وایە، کەشێوە و شێوازێک دەدات بە خانەکە | | |



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## خاسیەتەکانی خانەکان (Field Properties)

| | Text | Number | Date/Time |
|---|---|---|---|
| Caption | دانانی ناوێک بۆ پێناسکردن و بەکارهێنانی لە کویری و فۆرم و ریپۆرت | | نییە |
| Default Value | دانانی نرخی سەرتایی | | |
| Validation Rule | بەپاسایەک داخڵکردنی داتا سنوردار بکەیت | | |
| Validation Text | پیشاندانی نامەیەکی ئاگادار کەرەوە لەکاتی پشتگوێخستنی (Validation Rule). | | |
| Required | نابێت خانەکە بە بۆشی بە جێ بهێڵرێت | | |
| Allow Zero Length | نابێت درێژی داتاکە سفربێت ئەگەر (No)بێت وە درێژی رێگە پێدراوە سفربێت ئەگەر(YES) دابنرێت. | | |

37





خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## خاسیەتەکانی خانەکان (Field Properties)

| | Text | Number | Date/Time |
|---|---|---|---|
| Indexed | بۆ زیادکردنی خێرایی (Join) وە هەروەها گەران(Search) | | |
| Unicode Compression | بۆ داخڵکردنی جورە پیتێکە لە نووسین کە پێویستی بە ١ بایتە | نییە | نییە |
| IME Mode, IME Sentence Mode | لەوە کومپیوتەرانە بەکاردێت کە لەئاسیا بەکاردێت کە کونترۆلی گۆرینی چەند زمانێک دەکات. | | |
| Smart Tags | بۆ دانانی نیشانەیەک لەسەر خانەکە کە پەیوەستی بەکارێکەوە نیشان بدات. | | |
| Text Align | رێکخستنی ریزی نووسین | | |
| Show Date Picker | نییە | نییە | نیشاندانی تەقویم |

38

## خاسیەتەکانی خانەکان (Field Properties)

- شێوازی ژمارەکان

| جۆر | ماوە | قەبارە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| Byte | 0-255 | ١ بایت | |
| Integer | -32,768 to 32,767 | ٢ بایت | |
| Long Integer | -2,147,483,648 to 2,147,483,647 | ٤ بایت | |
| Single | -3.4 1038 to 3.4 1038 | ٤بایت | ٧ دیجیت |
| Double | -1.797 10308 to 1.797 10308 | ٨ بایت | ١٥ دیجیت |
| Decimal | -7.9228 1028 to 7.9228 1028 | ١٢ بایت | |
| ReplicationID | | ١٦ بایت | |





## خاسیەتەکانی خانەکان (Field Properties)

- تابی لووک ئەپ(lookup Tab)
- ئەم تابە بۆ دوو مەبەست بەکاردێت.
  - دیاریکردنی جۆری خانەکە، کە چ کۆنترۆلێک وەربگرێت.
  - دیاری کردنی لیستی نرخ بۆ کۆنترۆلی کۆمبۆکس، جا شێوەی داینامیکی بێت یاخود ستاتیکی.









## خاسیەتی شێواز (Format Property)

- خاسیەتی شێواز (Format Property) ئەم خاسیەتە بۆ گۆڕینی شێوازی نیشاندانی داتاکان بەکاردێت.
- ئەوە داتا حەقیقەتەی داخلکراوە گۆڕانکاری بەسەر نایەت.
- ئەم خاسیەتە بۆ هەموو جۆرەکانی داتاکان بەکاردێت.

هەندێک هێما وپیت بۆ شێوازی نووسین(Text)وە بۆ مێمۆ(Memo)

| هێما و پیت | زانیاری |
|---|---|
| @ | بۆ نیشاندانی نووسین و بۆشایی ئەگەر نووسین نەبوو. |
| & | تەنیا نووسینەکە نیشان ئەدات. |
| < | نیشاندانی پیتەکانی ئینگلیزی لە نووسین بە سمۆڵ، دەبێت لە پێشی نیشانەی (!) هەبێت. |
| > | نیشاندانی پیتەکانی ئینگلیزی لە نووسین بە کەپیتاڵ، ، دەبێت لە پێشی نیشانەی (!) هەبێت. |
| ! | لەگەڵ نیشانەی تر بەکاردێت بۆ گۆرینی شێوازی نیشاندان |





خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## خاسیەتی شێواز (Format Property)

- هەندێک هێما وپیت بۆ شێوازی ژمارە(Number) وە دراوەکان(Currency)

| هێما و پیت | زانیاری |
|---|---|
| # | بۆ دیاری کردنی شێوازی نیشاندانی ژمارەکان، هێمای سالب وموجەب و سپەیس |
| 0 | تەنیا دەتوانرێت ژمارە داخل بکرێت |
| , | وەکو جیاکەرەوە بەکاردێت |
| . | بۆ ژمارە کەرتی دەیی |
| % | بۆ شێوازی رێژە |
| E- یان e- | بۆ شێوازی توانی سالب |
| E+ یان e+ | بۆ شێوازی توانی موجەب |
| ! | بۆ دانانی پیت لەگەڵ ژمارەکان |

## خاسیەتی شێواز(Format Property)

- هەندێک شێوازی کات و بەروار(Date/Time)

| هێما و پیت | شێوازەکەی |
| --- | --- |
| General Date | 6/28/2015 08:19:23 PM |
| Long date | Tuesday, June 28, 2012 |
| Medium date | 28-Jun-12 |
| Short Date | 6/28/2012 |
| Long Time | 8:19:23 PM |
| Medium Time | 08:19 PM |
| Short Time | 20:19 |





## ماسکی داخلکردن(Input Mask)

- خاسیەتی ماسکی داخلکردن(Input Mask) بۆ دوو مەبەست بەکاردێت
  - کۆنترۆلکردنی ئاستی داخلکردن
  - دانانی شێواز بۆ داتاکان
- ئەتوانیت ماسکێکی دیاری کراو بۆ خانەکانی خشتە دابنێیت
- خاسیەتی ماسکی داخلکردن کاریگەری دەبێت لە سەر چۆنیەتی داخلبوونی داتاکە.
- ماسکی داخلکردن تەقویم دەشارێتەوە لە جۆری خانەی کات و بەروار.

| | |
| --- | --- |
| Field Size | Long Integer |
| Format | |
| Decimal Places | Auto |
| Input Mask | |
| Caption | |
| Default Value | |
| Validation Rule | |
| Validation Text | |
| Required | No |

## ماسکی داخلکردن(Input Mask)

| پیت | ڕونکردنەوە |
|---|---|
| 0 | پێویستە ژمارە بنووسرێت لە سفر تا نۆ |
| 9 | دەتوانرێت ژمار بنووسرێت لە سفر تا وەکو نۆ |
| # | دەتوانرێت ژمارە بنووسیت و نیشانەی سالب و موجەبیش دابنرێت |
| L | پێویستە پیتێک بنووسی |
| ? | دەتوانی پیتێک بنووسی |
| A | پێویستە لەسەرت پیتێک یا خود ژمارەیەک بنووسی |
| A | دەتوانرێت پیتێک یا خود ژمارەیک بنووسی |
| & | پێویستە پیتێک یا خود سپەیسێک بنووسی |
| C | دەتوانرێت پیتێک یاخود ژمارەیەک بنووسرێت |





## ماسکی داخلکردن(Input Mask)

| پیت | ڕوونکردنەوە |
|---|---|
| > | هەموو پیتەکان دەکات بە کاپیتاڵ |
| < | هەموو پیتەکان دەگۆڕێت بۆ سمۆڵ |
| ! | پڕکردنەوە لە چەپەوە بۆ ڕاست |
| "" | پیتەکان لە نێوان ئەم نیشانانە دەنووسرێن |

## Validation Rule & Validation Text

- دانانی یاسایەک بۆ ڕێکخستن و سنوردارکردن داخلکردنی داتا بۆ خانەکان.
- Validation Text نامەی ئاگادارکردنەوە لەکاتی پشتگوێخستنی یاسای سنوردارکردن(Validation Rule)
- ئەوە جۆرە داتایەی هەڵێنەبژێری ئەوا ئەهێنە جۆری ئەو یاسەیەی دای ئەنێت.

| یاسا | نامەی ئاگادار کردنەوە |
|---|---|
| <>0 | با ژرخەکەی سفر نەبێت |
| >=0 | پێویستە ژمارەکە سفربێت یاخود ژمارەی موجەب بێت |
| 0 or >100 | پێویستە ژمارەکە سفر بێت یاخود لە سەد گەورەتربێت |
| BETWEEN 0 AND 1 | ژمارەکە کەرتبێت، لەنێوان یەک و سفر دابێت |
| <#01/01/2007# | بەروارێک پێش ساڵی ٢٠٠٧ |
| >=#01/01/2007# AND <#01/01/2008# | پێویستە بەروار تەنیا لە ماوەی ساڵی ٢٠٠٧ دابێت |





## Validation Rule & Validation Text

| | |
|---|---|
| <Date() | نابێت لەبەروارێکی داهاتوو بێت |
| >=Int(Now()) | بەروارەکە دەبێت ئەمڕۆ بێت |
| M Or F | (M)بۆ نێر وە (F) بۆ مێ |

- نموونە : لە خشتەی بەشەکان لە داتابەیسی تۆمارگای زانکۆ خانەی بەرواری لەدایک بوون نابێت بەروارێک بێت لە بەرواری ئێستا گەورەتربێت سەرەتا دێینە سەر خشتەی (بەشەکان)
  - کلیک لەسەر ( Design View ) دەکەین.
  - پاشان لەبەشی خاسیەتی خانەکان لە خاسیەتی خانەی (بەرواری لەدایک بوون) لە ( Validaton Rule) ئەم ئەنووسین (
  - <Date() )وە لە ( Validation Message ) بنووسە (ناوی بەش نابێت لە ١٢ پیت گەورەتبێت)

## Lookup Wizard

| Field Name | Data Type |
| --- | --- |
| ژمارە | AutoNumber |
| کۆدی باخ | Number |
| ناوی جوارى | Text |
| رەگەز | Text |
| بەرواری لە دایک بوون | Date/Time |
| گرووپی خوێن | Text |
| کۆدی کۆلێژ | Text |
| بەشە ناوخۆیی | Yes/No |

| ناوی جوارى | بەرواری لە دایک بوو | گرووپی خوێن |
| --- | --- | --- |
| سازگار علی خورشید محمد | 01-01-1991 | A+ |
| سامان میرزا حمد عزیز | 30-11-1995 | B+ |
| | 30-12-2016 | |

Microsoft Access

تکایە بەروارێکی دروست بنووسە

OK Help

General Lookup

| | |
| --- | --- |
| Format | dd-mm-yyyy |
| Input Mask | |
| Caption | |
| Default Value | |
| Validation Rule | <Date() |
| Validation Text | تکایە بەروارێکی دروست بنووسە |
| Required | No |
| Indexed | No |
| IME Mode | No Control |
| IME Sentence Mode | None |
| Smart Tags | |
| Text Align | General |
| Show Date Picker | For dates |





## خاسیەتەکانی خانەکان (Field Properties)

- تابی لووک ئەپ(lookup Tab)
- ئەم تابە بۆ دوو مەبەست بەکاردێت.
  - دیاریکردنی جۆری خانەکە، کە چ کۆنترۆلێک وەربگرێت.
  - دیاری کردنی لیستی نرخ بۆ کۆنترۆلی کۆمبۆکس، جا شێوەی داینامیکی بێت یاخود ستاتیکی.

General Lookup

Display Control: Text Box

- Text Box
- List Box
- Combo Box

## Lookup Wizard

- ئەم خاسیەتە تەنیا لەسەر نووسین (Text) ،ژمارە(Number) وە (Yes/No) جێ بەجێ دەکرێت، کە لەڕێگەیەوە ئەم خانەیە ئەم خاسیەتی پێئەدرێت داتاکانی لە لیستێک وەردەگرێت.
- دوو ڕێگا هەیە بۆ دانانی ئەم خاسیەتە :
  - لیستێکی نەگۆڕ لە نرخ
  - لیستێک لە نرخ کە لە خشتەیەک یا کوێریەک وەری بگرێت.



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## Lookup Wizard

- نموونە: خانەی کۆدی کۆلێژ لە خشتەی خوێندکار بکە بە لووک ئەپ کە ناوی کۆلێژ لەو خانەیە نیشان بدرێت.
- - ئەچینە سەر خشتەی (خوێندکار)، پاشان کلیک لەسەر (Design View)ئەکەین.
- ئەچینە سەر خانەی (ناوی کۆلێژ) پاشان (Data Type)یکەی ئەگۆڕین بۆ (Lookup).



## Lookup Wizard



- لەو بۆکسەی بۆت ئەکرێتەو دانەی
- یەکەمیان هەڵئەبژێریت، پاشان (Next)ئەکەیت.
- ئەو خشتەیە هەڵئەبژێریت کە ئەتوێت لووک ئەپی نرخی خانەیکی بکەیت، وە لەوێدا هەلینەبژێریت کە دەتوێت لە خشتە یاخود کوێری یاخود هەردووکیان لووک ئەپ دەکەیت.
- پاشان (Next)ئەکەین.
- لە دوایدا ئەو خانانە هەڵئەبژێرین کە ئەمانەوێت لووک ئەپیان بکەین.





## Lookup Wizard



- پاشان لە ویندۆیەی بۆ مان ئەکرێتەوە
- ڕێگای ڕیزکردنی هەڵئەبژێرین کە بەکام خانەیە ڕیزی بکەین.

پاشان (Cascade Delete) دەکەین وەکلیک لەسەر (Finish)



| گرووپی خوێن | کۆلێژ |
|---|---|
| A- | زمانی ئینگلیزی |
| AB- | ئەندازیاری پرۆگرامسازی |
| B- | ئەندازیاری پرۆگرامسازی |
| A- | زمانی ئینگلیزی |
| A- | ئەندازیاری پیشەسازی |







## مۆدێلی پەیوەندیدار (The Relational Model)

- مۆدێلی پەیوەندیدار (The Relational Model) هەڵدەستێت بە پێناسکردنی ئەو ڕێگەی کە دەتوانرێت لێیەوە داتاکانی تێدا نیشان بدرێت، ئەو ڕێگەیە کە لە ڕێیەوە داتاکانی پێ دەپارێزیت، وە ئەو کردارانەی کە بەسەر داتاکەدا جێ بەجێ ئەکرێت.
- هەر پەیوەندی دارێک خشتەیەکە کە پێک دێت لە ڕۆو کۆلۆم.
- کۆڵۆم ناوی تایبەتمەندیەکانی خشتە نیشان ئەدات، بۆ نموونە لە خشتەی مرۆڤ تایبەندی ناو و تەمەن.
- ڕۆ داتای تایبەتمەندیەکانی خشتە نیشان ئەدات، بۆ نموونە خشتەی مرۆڤ لە تایبەتمەندی ناو، ئەحمەد ئەنووسرێت.





خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## مۆدێلی پەیوەندیدار (The Relational Model)

- خاڵی سەرەکی لە مۆدێلی پەیوەندیدار ئەو پەیوەندیە کە لەنێوان خشتەکان دا هەیە.
- پەیوەندی دروست نابێت لە داتابەیس تاوەکو داتابەیسەکەمان نۆرماڵ نەکەین.
- نۆرماڵکردن پرۆسەی جیاکردنەوەی خشتەکانە بە گوێرەی پێداویستیەکان.
- بۆ ئەوەی بتوانین پەیوەندی دروست بکەین ئەبێ دوو کلیلمان هەبێت
  - کلیلی سەرەکی (Primary Key)
  - کلیلی فۆرین (Foreign Key)

## کلیلی سەرەکی (Primary Key)

- کلیلی سەرەکی (Primary Key) دەروازەی سەرەکی پەیوەندی دروستکردنە لە هەموو خشتەیەک.
- خشتەیەک ئەگەر کلیلی سەرەکی نەبێت ناتوانرێت پەیوەندی تێدا دروست بکرێت و داتاکانی بەکاربهێنرت لە خشتەکانی تری داتابەیس.
- هەموو خشتەیەک پێویستە کلیلێکی سەرەکی هەبێت.
- کلیلی سەرەکی پێویستە دووپاتبوو نەبێت بەڵکو (Unique) بێت وە هەروەها نرخی بەتاڵیشی(null) نەبێت.



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## کلیلی سەرەکی (Primary Key)

- بۆ نموونە : خشتەی خوێندکار، کە زانیاری خوێندکار تێدایە، خانەی ژمارە کلیلی سەرەکی لەسەر دادەنرێت.

| ژمارە | ناوی سیانی | ڕەگەز | بەرواری لەدایک بوون | زانکۆ |
|---|---|---|---|---|
| 665 | ئازاد حمد ئەحمەد | نێر | 01-02-1993 | کۆیە |
| 887 | کالی سابیر جەبار | مێ | 23-07-1994 | سەلاحەدین |
| 987 | سامان کەریم لقمان | نێر | 12-11-1996 | سلێمانی |

Primary Key



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## کلیلی فۆرین(Foreign Key)

- کلیلی فۆرین لە ڕاستیدا کلیلێکی سەرەکیە(Primary key) لە خشتەیەک کە نیشان ئەدرێت لە خانەیکی خشتەیەکی تر، کاتێک خشتەی یەکەم پەیوەندیەکی هەبێت لەگەڵ خشتەی دووەم.
- ئەو خانەیەی کە کلیلی فۆرینی هەیە هەموو خاسیەتەکانی بەستراوەتەوە بەو خانەی کە کلیلی سەرکیە لەسەرە لە خشتەکەی تر.





خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## جۆرەکانی پەیوەندی (The Relationship Types)

- جۆرەکانی پەیوەندی بە گوێرەی ئەوەی چەند تۆمار لە خشتەیەک پەیوەندی هەیە لە گەڵ چەند تۆماری خشتەی بەرامبەر دابەش دەبێت بۆ سێ جۆر:
  - One-To-Many
  - One-To-One
  - Many-To-Many

## One-To-Many

One-To-Many: واتا هەر تۆمارێک لە خشتەی یەکەم چەندین تۆماردی وەکو خۆی هەیە لە خشتەی دووەم.

**Table A**

| Coord. | EPA Reg |
|---|---|
| John | 1 |
| Judy | 2 |
| Doug | 3 |
| Bob | 4 |
| Larry | 5 |
| Sue | 6 |
| Frank | 7 |

**Table B**

| EPA Reg. | State |
|---|---|
| 3 | PA |
| 3 | WV |
| 3 | DE |
| 4 | TN |
| 4 | NC |
| 1 | RI |
| 2 | NY |



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## One-To-One

One-To-One: ئەو دوو خشتەیەی کە پەیوەندیان هەیە، خانەیەکی هاوبەش هەیە لە نێوانیان کە هەمان داتای تێدایە، هەر تۆمارێک لە خشتەی یەکەم تەنیا یەک تۆماری وەکو خۆی هەیە لە خشتەی دووەم، وە هەر تۆمارێک لە خشتەی دووەم تەنیا یەک تۆماری وەکو خۆی هەیە لە خشتەی یەکەم.

| Name | Flow (MGD) | Source ID |
|---|---|---|
| MWWTP | 3.4 | A |
| Pickle Plant | 0.3 | B |
| Hospital | 1.8 | C |

1 to 1

| Source ID | Latitude | Longitude |
|---|---|---|
| A | 36.4 | -76.8 |
| B | 38.5 | -74.2 |
| C | 41.0 | -72 |

## Many-To-Many

Many-To-Many: واتا چەندین تۆمار لەخشتەی یەکەم چەندین تۆماری هەیە لەخشتەی دووەم.








## هەنگاوەکانی دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان خشتەکان

بۆ دروستکردنی پەیوەندیەکان پێویستە ئەمانە بکرێت لە پێشدا:

هەموو کلیلە سەرکیەکان(Primary Key) زیاد کرابن بۆ خشتەکان.

هەموو ئەو خانانە زیاد کرابن کە فۆرین کی(Foreign key) یان لەسەر دەبێت.

هەنگاوەکان :

- کلیک لەسەر تابی (Database Tools) پاشان کلیک لەسەر (Relationships) بکە.



## هەنگاوەکانی دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان خشتەکان

- هەموو خشتەکان دابخە (Close) پێش ئەوەی پەیوەندی دروست بکەیت.
- بۆکسێک نیشان ئەدرێت کە لێیەوە ئەو خشتانە هەڵئەبژێریت کە ئەتەوێت پەیوەندی لەنێوانیان دروست بکەیت.




- ئەو خشتانەی زیادی ئەکەی ڕاستەوخۆ بۆ ویندۆکە زیاد ئەبێت.
- پاشان بە گوێرەی ئەو خشتانەی هەمانە پەیوەندیەکان دروست دەکەین.







## هەنگاوەکانی دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان خشتەکان

- سەهمی ماوسەکەمان دەبەینە سەر ئەو خانەیەی کە دەمانەوێت پەیوەندی بگرێت لەگەڵ خانەیەکی تر لە خشتەی بەرامبەری، پاشان ڕای دەکێشین تاوەکو دەیخەینەوە سەر خانەی بەرامبەری.








## Referential Integrity

- ڕیفرێنشاڵ ئینتیگریتی خاسیەتێکی سەرەکی داتابەیسە کە تێیدا بۆ پتەوکردن پەیوەندی نێوان خشتەکان بەکاردێت.
- کاتێک خشتەیەک فۆرین کی(Foreign Key) هەیە لەگەڵ خشتەیەکی تر، بۆیە خاسیەتی ڕیفرێنشیان ئینتیگریتی کە لەوانەیە بۆ ئەو تۆمارە زیاد نەکرابێت کە لەگەڵ ئەوەشدا تۆمارێکی تر وەکو خۆی لەو خشتەیەی هەیە کە پێیەوە بەستراوەتەوە.
- ئەو تەکنیکانەی کە تەکنیکی ڕیفرێنشان ئینتیگریتین بریتیە لە بەیەکەوە بەستنی حاڵەتی سڕینەو گۆڕانکاری تۆمارە بەیەکەوە بەستراوەکان لە پەیوەندی دوو خشتە
- ئەم تەکنیکانە بە (Cascade Update)و (Cascade Delete) ناسراون.
- ئەمەش زامنی پاراستنی پەیوەندی نێوان خشتە پەیوەندارەکانە، وە دڵنیای دانە بەوەی کە هەر گۆڕانکاریەک لە خشتەی سەرەکی کە پرایمەری کی لەسەرە بکرێت هەمان گۆڕانکاری لە خشتە پەیوەند دارەکەی دا دەبێت.








## Referential Integrity

- هەندێک دەرچوون لە یاساکانی ڕیفرێنشیان ئینتیگریتی:

1. گۆڕنکاری کردن لە تۆمارێکی خانەی پرایمەری کی لە خشتەی یەکەم، کە هەمان تۆمار لە خشتەی دووەمدا هەبێت.
2. سڕینەوەی تۆمارێکی خانەی پرایمەری کی لە خشتەی یەکەم، کە هەمان تۆمار لە خشتەی دووەمدا هەبێت.
3. زیاد کردنی تۆمارێک بۆ خانەی فۆرین کی کە لەخانەی پرایمەری کی خشتەی پەیوەندی پێوەکراو دا نەبێت.
4. گۆڕنکاری کردن لە تۆمارێکی فۆرین کی، بێ گەڕانەوە بۆ خانەی پرایمەری کی.

## Referential Integrity

• بۆ دانانی خاسیەتی ڕیفرێنشیان ئینتیگریتی لە مایکرۆسۆف ئەکسس پێویستە لەکاتی دروستکردنی پەیوەندیەکان ئەم خاسیەتە زیاد بکرێت، ئەویش ئارەزوومەند کراوی لە وەی ئەتەوێت ئەم خاسیەتە زیاد بکەیت یاخود نا کە بەشێک لە یاسا دەرچوونەکان چارەسەر دەکات، بەم شێوەی خوارەوە:

Edit Relationships

Table/Query: | Related Table/Query:

ژمارەی شۆفێر | ژمارە

Enforce Referential Integrity

Cascade Update Related Fields

Cascade Delete Related Records

Relationship Type: One-To-One

Create / Cancel / Join Type.. / Create New..

شۆفێر: ژمارە، ناوی سیانی، رەگەز، بەرواری لەدایک بوون، کار

خاسیەتی نەپدەیت و گۆڕانکاری واتە هەرگۆڕانکاریەک ڕوویدات پراجەری ک لە خشتەی بەرامبەریشی ڕوودەدات



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## Referential Integrity

• بۆ دانانی خاسیەتی ڕیفرێنشیان ئینتیگریتی لە مایکرۆسۆف ئەکسس پێویستە لەکاتی دروستکردنی پەیوەندیەکان ئەم خاسیەتە زیاد بکرێت، ئەویش ئارەزوومەند کراوی لە وەی ئەتەوێت ئەم خاسیەتە زیاد بکەیت یاخود نا بەم شێوەی خوارەوە:

Edit Relationships

Table/Query: | Related Table/Query:

ژمارەی شۆفێر | ژمارە

Enforce Referential Integrity

Cascade Update Related Fields

Cascade Delete Related Records

Relationship Type: One-To-One

Create / Cancel / Join Type.. / Create New..

شۆفێر: ژمارە، ناوی سیانی، رەگەز، بەرواری لەدایک بوون، کار

خاسیەتی سڕینەوە، واتە هەر تۆمارێک لەخشتەی سەرەکی بسڕدرێتەوە ئەوە لەخشتەی دووەمیش کەپێوەی بەستراوە دەسڕدرێتەوە



# خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس لە کۆیە

## بەشی دووەم

## دروستکردنی کوێری





خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس
وانەی دووەم
The Query




خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس


## کوێری چییە؟ (What is query?)

- کوێری ئامرازێکە بۆ گەڕاندنەوەی داتاکان لە داتابەیس، کەوەکو فەکشنێکە بۆ گەڕاندنەوەی داتاکانی خشتەکان.
- کوێری دەتوانێت داتای زیاتر لە خشتەیەک بگەڕێنێتەوە.
- ئەو داتایانەی کە کوێری وەریان دەگرێت بە هەمان شێوەی خۆیان دەمێننەوە لە نێو خشتەکانیان.
- بەکارهێنەر داواکاریەک پێشکەش دەکات، ئامرازی کوێری هەڵدەستێ بە گەڕان بەناو ئەو خشتانەی هەن لە داتابەیسەکە، وە هەموو ئەو زانیاریانە ئەگەڕێنەوە کە بەکارهێنەر داوای دەکات.







## کوێری چییە؟ (What is query?)

- کوێری زمانێکی دیاری کراو بەکار دەهێنت، پێی دەڵێن(SQL)
- SQL زمانی ڕەسمی و ستانداردی هەموو داتابەیسێکە، هەموو جۆرە داتابەیسانەی هەن لە ( Microsoft Acces, MySql, Sql Server, Oracle ) هەموویان لەسەر بنچینەی (SQL) دانراون، کە هەریەکێکیان بە گوێری کات گۆڕانکاریان بەسەردێت بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکان، وە هەریەکێکیان خاوەن شێوازێکی تایبەتی (SQL)ی تایبەتی خۆیەتی بەڵام هەموویان بنچینەیەکی هاوبەشیان هەیە.
- کوێری لە داتابەیس هەر کاری کۆکردنەوەی داتا ناکات، بەڵکو داتاکان ئەگەڕێنێتەوە بۆ بەکارهێنەر وە هەڵدەستێ بە شیکردنەوە و ژمێرکردنی داتاکان.









## کوێری چییە؟ (What is query?)

- کوێری هەموو پرۆسەکانی گەڕان بەدوای داتا کان ئاسان دەکات، کە لە سیستەمی فایلات گەڕان بە دوای داتاکان ئاسان نییە.
- لە مایکرۆسۆفت ئەکسس چەند ئامرازێک پشت دەبەستن بە کوێری :
  - فۆرم(Form)
  - ڕیپۆرت(Report)
- فۆرم و ڕیپۆرت دوو ئامرازی ترن بۆ نیشاندانی داتا بە بەکارهێنەر.
- کوێری هەڵئەستێ پرۆسەی دژەنۆرماڵکردنی داتاکان، لە کاتێکدا داتاکان لە خشتە نۆرماڵن.



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## جۆرەکانی کوێری

- چەندین جۆر کوێریمان هەیە لە مایکرۆسۆفت ئەکسس، کە ئەمانەن:
  - Select Query
  - Total Query
  - Action Query
  - Crosstab
  - SQL

5

ئامادەکردنی: ئەندازیار کیوان سلێمان




خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس




## SELECT Query

- SELECT Query یەکێکە لە کوێریە باوەکان.
- زانیاریەکان دیاری دەکرێت لە خشتەیەک یاخود زیاتر، کە هەموو خانەکان یاخود بە سنوردارکراوی دیاری دەکرێن.
- دەتوانرێت داتاکان ریزبکرێن بە چەندین شێواز، ئینجا ریزکردن لە سەر خانەیەک یا خود زیاتر.
- ئامرازی دیزاینکردنی کوێری(Query Designer Tool) بەکاردێت بۆ دروستکردنی کوێری لە جیاتی ئەوەی کۆدی (Sql) بنووسی.

6

ئامادەکردنی: ئەندازیار کیوان سلێمان

## Total Query

- جۆرێکی تایبەتی (Select Query)یە
- کە هەڵدەستێت بە شیکردنەوەی داتاکان بە بەکارهێنانی کردارەکانی کۆکردنەوە وەکو (count)،(sum) وە (Group by).
- داتاکان شی ئەکرێنەوە بۆ هەموو یان گروپێک لە تۆمارەکانی خشتەکە.

Totals

| | | | |
|---|---|---|---|
| Field: | Employee ID Group: E | Employee Name: (Last | Order Amount |
| Table: | Employees | | Orders |
| Total: | Group By | Group By | Sum |
| Sort: | Ascending | | |
| Show: | ☑ | ☑ | ☑ |





## Action Query

- ئەم جۆرە کویریە بەکاردێت بۆ گۆڕانکاری کردن لە داتاکان، وەکو زیادکردن و سڕینەوە و گۆڕین وە هەروەها دروستکردنی خشتە.
- ئەم جۆرە کویریە گۆڕانکاری بەسەر تەواوی گروپێک یا خود هەموو تۆمارەکان دەهێنێت.
- Make-Table Query: دروستکردنی خشتە و وەزیاترکردنی داتا بۆی بە کویرەی کویریەک.
- Append Query: : زیادکردنی داتا بۆ خشتەیەکی ئامادەکراو یاخود تازە.
- Update Query: : گۆڕانکاری کردن لە داتاکان.
- Delete Query: سڕینەوەی داتاکان.



## Crosstab Query

- شێوازێکی تری کوێریە، کە داتاکان بەشێوەی ماتریکس نیشان ئەدات.
- ڕیز و کۆڵۆمەکان دروست دەکرێن بەبەکارهێنانی داتاکان.
- بڕی ترخی خانەکان بە بەکارهێنانی کردارەکانی کۆکردنەوە.

Query1 : Crosstab Query

| SaleMonth | <> | AB | CA | NY | PA | TX |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 05-Jan | | | | | $52.50 | $75.00 |
| 05-Oct | | $16.00 | | | | |
| 05-Sep | | | | $225.00 | | |
| 06-Apr | $55.00 | | | $250.00 | | |
| 06-Feb | | | $52.50 | | | $750.39 |
| 06-Jan | $55.00 | | $160.00 | $100.00 | | |
| 06-Mar | | $16.00 | | $225.00 | | |





## SQL Query

- ئەم جۆرە کوێریە بەکاردێت بۆ کوێریانەی کە ناتوانرێت بە کوریەکانی تر دروست بکرێن.
- ئەم جۆرە کوێرەیە بە نووسین ئەکرێت بە شێوەی گرافیکی ناکرێت.
- ئەوەی جێی تێڕامانە ئەوەیە کە هەرچی جۆری کوێری هەیە لە مایکرۆسۆفت ئەکسس ئەوا لەسەرئەم جۆرە کوێریە داڕێژراوە.






خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



## تواناکانی کوێریەکان

- دەستنیشان کردنی خشتە.
- دەستنیشان کردنی خانەکان.
- دەستنیشانکردنی تۆمارەکان.
- سۆرتکردن و ڕیزکردن داتاکان.
- دروستکردنی خشتە.
- دروستکردنی فۆرم و ڕیپۆرت لەسەر کوێری.
- دروستکردنی کوێری لەسەر کوێری.
- دروستکردنی گراف لەسەر کوێری.
- گۆڕانکاری کردن لە داتاکانی خشتەکان.

11

ئامادەکردنی: ئەندازیار کێوان سلێمان



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس



خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## The SELECT Query

ئامادەکردنی: ئەندازیار کێوان سلێمان







## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس

- هەنگاوەکانی دروستکردنی کوێری لە مایکرۆسۆفت ئەکسس بەم شێوەیە:
  - تابی (Create) سەلێکت بکە، پاشان لەبەشی کوێری کلیک لەسەر (Query Design) بکە.
  - لەو بۆکسەی ئەکرێتەوە، ئەو خشتە هەڵبژێری کە دەتەوێت کوێریان لێ دروست بکەی، پاشان بۆ کسەکە دادەخێتەوە.
  - خانەکان زیاد بکە، (Expression) دروست بکە و (Criteria) دەستنیشان بکە، وە سەیری ئەنجامەکانیش بکە.
  - پاشان کوێریەکەت خەزن بکەو ناوێک گونجاوی بۆ دابنێ.









## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس



## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس

نموونە : کویرەیەک دروست بکە لە خشتەی (xwendkar_tbl) کە تێیدا تەنیا خانەی (nawi_syani) و(kcode) ناوی سیانی لەگەڵ کۆلێژەکەی نیشان بدرێت.

- سەرەتا ئەچینە سەر تابی (Create)
- پاشان ئەچینە سەر (Query Design) ئینجا کلیکی لەسەر دەکەین.
- پاشان لەو بۆکسەی بۆمان دەکرێتەوە، خشتەی(xwendkar_tbl) ئادد دەکەین، وەکو لەوێنەی پەرەی دواتر نیشان دراوە.








## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس








## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس









خولی فێربوونی مایکرۆسۆفت ئەکسس

## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس

پاشان کلیک لەسەر (Run) بکە بۆ نیشاندانی کوێریەکەت.




دوای ئەمە کلیک لەسەر (Save) بکە ناوێکی گونجاو بۆ کوێریەکە دابنێ، بۆ ئەم نموونەی خۆمان بنووسە (xdbash_qr).









## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس

- ناوی کوێریەکان نابێت هەمان ناوی خشتەکان بێت.
- دەتوانین کوێری دروست بکەین بە بەکارهێنانی (Query Wizard) کە چەندین هەڵبژاردەمان ئەداتێ بۆ دروستکردنی کوێری.












## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس

- ڕووکاری دیزاینەری کوێری (Query Designer) دابەش دەبێت بۆ دووبەش:
- بەشی سەرەوە پێی دەگوترێت شوێنی داخلکردنی خشتەو کوێری( Table/Query Entry area) وە بەشی خوارەوەش پێی دەگوترێت (Design Grid area)
- Table/Query area: خشتەو کوێری وە هەروەها پەیوەندیەکانیش لەوێ نیشان ئەدرێت.
- Design Grid area: سلێکتی خانەکان دەکەی بۆی، ڕیزیان دەکەی(Sort) وە(Criteria) دەستنیشان دەکەی.






## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس











## هەنگاوەکانی دروستکردنی (SELECT Query) لە مایکرۆسۆفت ئەکسس

بەشەکانی (Query Design Grid)

- Field: بۆ دیاریک کردنی ئەو خانەیە کە دەمانەوێت لە کوێریەکە.
- Table: ئەو خشتەیەی کە خانەکەی لێوردەگرین.
- Sort: ریزکردنی خانەکان
- Show: ئایا دەتوێت خانەکە نیشان بدرێت یان نا
- Criteria: بە ڕێسایەیەک ئەو نرخی ئەو خانانە دیاری بکەیت کە خۆت ئەتەوێت.
- Or: ئەگەر بتەوێت لەگەڵ (Criteria) ڕێسای تریش دابنێیت.

ریزکردنی خانەکان لەلای چەپەوە بۆ ڕاست دەست پێدەکات.

